# ڕۆژووەکەت

## بەگوێرەی سوننەت بشکێنە

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم





ڕەمەزانی ١٤٤٤هـ

# ڕۆژووەکەت

## بەگوێرەی سوننەت بشکێنە

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

ڕەمەزانی ١٤٤٤هـ

# پێشەكی

الحمد لله رب العالمين، وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين؛ أما بعد:

ڕۆژوو پەرستشێكی تایبەتە، و ڕۆژووی ڕەمەزان یەكێكە لە پایەكانی ئیسلام، و خوا ﷻ ڕۆژووی تایبەتكردووە بە خۆیەوە، تەنها خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی ڕۆژووەوان دەداتەوە، وەك دەفەرموێت: ((كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إلاَّ الصِّيامَ، فَإنَّهُ لِي وأنا أجْزِي بِهِ))[1].

لەبەر ئەو گەورەی و فەزڵەی ڕۆژوو پێویستە موسڵمان گرنگی بە ورد و درشتی حوكمەكانی بدات و هەوڵبدات هەتاكو لە توانایدایە بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پەرستشە بەجێ بهێنێت، و نییەتی پاك بكاتەوە و بەدڵسۆزییەوە تەنها بۆ خوا ڕۆژووبگرێت، چونكە ئەو دوو مەرجە مەرجی قەبوڵبوونی كردەوەیە، ئەگەر كردەوە بە گوێرەی سوننەت نەبێت دەچێتە ژێر بابەتی بیدعەوە، و ئەگەر بە دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ ئەنجام نەدرێت دەچێتە ژێر بابەتی شیرك و

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

ڕیاییەوە، لەم نامیلکەیە هەوڵدەدەم چۆنییەتی ڕۆژووشکاند بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوون بکەمەوە بەوهیوایەی خوێنەری موسڵمان سودی لێ ببینێت و لە کاتی شکاندنی ڕۆژووەکەی ڕەچاوی ئەو حوکمانە بکات کە لە دووتوێیدا هاتووە.

عوسمان ئەحمەد حاتەم

١رمضان١٤٤٤هـ

٢٠٢٣/٣/٢٣

گەرمیان ـ کەلار

  

## پێناسەی ڕۆژووشکاندن (ئیفتارکردن)

له زماندا: (فطر) مانای درز و شەقبردنە، و بە (فطور) کۆ دەکرێتەوە، و لە قورئاندا خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ٣﴾(المُلْك)، و دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١﴾(الانفِطَار)[1].

و لە شەریعەتدا بەو خواردن یان خواردنەوەیە دەگوترێت کە ڕۆژووەوان دوای خۆرئاوابوون دەیخوات یان دەیخواتەوە و ڕۆژووەکەی پێ دەشکێنێت، و بەربانگی پێ دەکاتەوە.

  

(١). بڕوانە: (لسان العرب)(٥/٥٥).

## کاتی ڕۆژووشکاندن

دوای ئاوابوونی خۆر ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ١٨٧﴾(البَقَرَة).

واتە: بخۆن و بخۆنەوە هەتاکو سپێدەی ڕاستی بەیان دەردەکەوێت و تاریکی شەو ڕادەماڵێت، پاشان بە ڕۆژووبن هەتاکو شەو.

ئەگەر بازنەی خۆر ئاوابوو شەوە، عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذا أقْبَلَ اللَّيْلُ مِن ها هُنا، وأدْبَرَ النَّهارُ مِن ها هُنا، وغَرَبَتِ الشَّمْسُ فَقَدْ أفْطَرَ الصّائِمُ))[١].

واتە: ئەگەر شەو لە ڕۆژهەڵاتەوە هات و ڕۆژیش لە ڕۆژئاواوە پشتی هەڵکرد، و خۆر ئاوابوو ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت.

ئیبن دەقیق العید دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ڕەدە لەسەر شیعە کە ڕۆژووشکاندنەکەیان دوادەخەن هەتاکو دەرکەوتنی ئەستێرەکان[٢].

  

(١). أخرجه البخاري ومسلم.
(٢). (فتح الباري)(٤/١٩٩).

## زوو ڕۆژووشکاندن

سوننەتە دوای ئاوابوونی خۆر پەلە بکرێت بۆ شکاندنی ڕۆژوو، سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا يَزالُ النّاسُ بخَيْرٍ ما عَجَّلُوا الفِطْرَ))(١).

واتە: بەردەوام خەڵك لە خێر و چاکەدان هەتا ئەو کاتەی پەلە بکەن لە شکاندنی ڕۆژوودا.

و ئەبوهورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا يَزالُ الدِّينُ ظاهِرًا ما عَجَّلَ النّاسُ الفِطْرَ، إنَّ اليَهُودَ والنَّصارى يُؤَخِّرُونَ))(٢).

واتە: بەردەوام ئاین ئاشکرایە هەتا ئەو کاتەی خەڵك پەلە بکەن لە شکاندنی ڕۆژوودا، بێگومان جوولەکە و گاور شکاندنی ڕۆژوویان دوادەخست؛ واتە: ئێوە شکاندنی ڕۆژوو دوامەخەن.

ئەبوعەتییە دەڵێت: ((دَخَلْتُ أنا ومَسْرُوقٌ، عَلى عائِشَةَ فَقُلْنا:

---

(١). متفق عليه.
(٢). أخرجه أبو داود و ابن حبان، وحسنه الألباني.

يا أُمَّ المُؤْمِنِينَ، رَجُلانِ مِن أصْحابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أحَدُهُما يُعَجِّلُ الإفْطارَ ويُعَجِّلُ الصَّلاةَ، والآخَرُ يُؤَخِّرُ الإفْطارَ ويُؤَخِّرُ الصَّلاةَ، قالَتْ: أيُّهُما الَّذِي يُعَجِّلُ الإفْطارَ ويُعَجِّلُ الصَّلاةَ؟، قالَ: قُلْنا عَبْدُ اللهِ يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ قالَتْ: كَذَلِكَ كانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللهِ ﷺ))، زادَ أبُو كُرَيْبٍ: والآخَرُ أبُو مُوسى[١].

واتە: من و مەسروق ڕۆیشتین بۆ لای عائیشەی دایکی باوەڕداران رضي الله عنها، گوتمان: ئەی دایکی باوەڕداران دوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکیان زوو ڕۆژوودەشکێنێت و زوو نوێژ دەکات، و ئەویتریان ڕۆژووشکاندنی دوادەخات و نوێژکردنی دوادەخات، گوتی: کێیە ئەوەیان زوو ڕۆژوودەشکێنێت و زوو نوێژ دەکات؟ گوتمان: ئیبن مەسعودە رضي الله عنه، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەیەی دەکرد؛ ئەبوکورەیب کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە دەڵێت: هاوەڵەکەی تر ئەبوموسا بوو رضي الله عنه.

و سەهلی کوڕی سەعد رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((لا تَزالُ أُمَّتِي عَلى سُنَّتِي ما لَمْ تَنْتَظِرْ بِفِطْرِها

(١). أخرجه مسلم.

النُّجُومَ، وكانَ النَّبِيُّ ﷺ إذا كانَ صائِمًا أمَرَ رَجُلًا فَأَوْفى عَلى نَشَزٍ، فَإذا قالَ: قَدْ غابَتِ الشَّمْسُ أَفْطَرَ))[١].

واتە: بەردەوام ئوممەتەکەم لەسەر سوننەتی منن ئەگەر بۆ ڕۆژووشکاندن چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەستێرەکان نەکەن، سەهل دەڵێت: و پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە ڕۆژووبووایە فەرمانی بە کەسێك دەکرد سەربکەوێت بەسەر بەرزییەکدا، ئەگەر بیگوتایە: خۆر ئاوابوو ڕۆژووەکەی دەشکاند.

و عبداللەی کوڕی ئەبوئەوفا رضي الله عنه دەڵێت: ((سِرْنا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وهُوَ صائِمٌ، فَلَمّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قالَ: انْزِلْ فاجْدَحْ لَنا، قالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أمْسَيْتَ؟ قالَ: انْزِلْ فاجْدَحْ لَنا، قالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ، إنَّ عَلَيْكَ نَهارًا، قالَ: انْزِلْ فاجْدَحْ لَنا، فَنَزَلَ فَجَدَحَ ثُمَّ قالَ: إذا رَأَيْتُمُ اللَّيْلَ أقْبَلَ مِن ها هُنا، فَقَدْ أفْطَرَ الصّائِمُ، وأشارَ بِإصْبَعِهِ قِبَلَ المَشْرِقِ))[٢]؛ وفي رواية: ((وقال: ولو تراآها أحد على بعيره لرآها، يعني الشمس))[٣].

---

(١). أخرجه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم وصححه الألباني.
(٢). أخرجه البخاري ومسلم.
(٣). أخرج هذه الزيادة عبدالرزاق في المصنف، قال الألباني في (مختصر صحيح البخاري)(١/٥٧١): سنده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: ئێوارەیەك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕێگادا دەڕۆیشتین بە ڕۆژووبوو، کاتێك خۆر ئاوابوو، بە کەسێکی فەرموو: دابەزە ئارد و ئاو یان شتی تر تێکەڵ بکە و شتێکمان بۆ ئامادە بکە بیخۆین، گوتی: بریا چاوەڕوان بکەیت هەتا شەو دادێت؟!، دووبارە پێی فەرموو دابەزە شتێکمان بۆ ئامادە بکە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هێشتا ڕۆژە، فەرمووی: دابەزە شتێکمان بۆ ئامادە بکە، دابەزی ئاردی لەگەڵ ئاو یان شتی تر تێکەڵکرد، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەگەر بینیتان شەو لە ڕۆژهەڵاتەوە داهات، و بە دەستی ئاماژەی بۆ ڕۆژهەڵات کرد، ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت؛ لە ڕیوایەتێکدا: ڕاوییەکە دەڵێت: ئەگەر لەسەر حوشترەکەیەوە سەیری خۆری بکردایە دەیبینی.

و ئەبودەردا رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثلاثٌ من أخلاقِ النُّبوَّةِ تعجيلُ الإفطارِ وتأخيرُ السُّحورِ، ووضعُ اليمينِ على الشِّمالِ في الصَّلاةِ))[1].

واتە: سێ شت لە ئاکار و خورەوشتی پێغەمبەرایەتییە: پەلەکردن لە ڕۆژووشکاندن، و دواخستنی پارشێوکردن، و دەستی ڕاست خستنە سەردەستی چەپ لە نوێژدا.

---

(١). أخرجه الطبراني و صححه الألباني.

قەیسی كوڕی ئەبوحازم دەڵێت: (نَاوَلَ عُمَرُ رَجُلاً إنَاءً إلَى جَنْبِهِ حِينَ غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ لَهُ: اشْرَبْ، ثُمَّ قَالَ: لَعَلَّك مِنَ الْمُسَوِّفِينَ بِفِطْرِهِ ؛ سَوف سَوف)[١].

واتە: لە كاتی بەربانگدا عومەر رضي الله عنه دوای ئەوەی خۆر ئاوابوو پەرداخێك ئاوی دایە كەسێك گوتی: بیخۆرەوە، پاشان گوتی: لەوانەیە لەو كەسانەبیت كە ڕۆژووشكاندنەكەیان دوادەخەن، و دەڵێن: كەمێكی تر، كەمێكی تر ڕۆژووەكەمان دەشكێنین؟!.

و عەمری كوڕی مەیمون دەڵێت: (إنَ أصْحابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أعْجَلَ النّاسِ إفْطارًا، وأبْطَأهَمْ سُحُورًا)[٢].

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو خەڵك بەپەلەتر بوون بۆ ڕۆژووشكاندن، و دواخستنی پارشێوكردن.

و ئیبن موسەیب لە باوكییە دەڵێت: (كُنْتُ جالِسًا عِنْدَ عُمَرَ إذْ جاءَهُ رَكْبٌ مِنَ الشّامِ فَطَفِقَ عُمَرُ يَسْتَخْبِرُ عَنْ حالِهِمْ، فَقالَ: هَلْ يُعَجِّلُ أهْلُ الشّامِ الفِطْرَ؟، قالَ: نَعَمْ قالَ: لَنْ يَزالُوا بِخَيْرٍ ما فَعَلُوا ذَلِكَ، ولَمْ يَنْتَظِرُوا النُّجُومَ انْتِظارَ أهْلِ العِراقِ)[٣].

(١). أخرجه ابن أبي شيبة.
(٢). أخرجه ابن أبي شيبة وعبدالرزاق والفريابي والبيهقي والطبراني وصححه النووي في المجموع.
(٣). أخرجه عبدالرزاق.

واتە: لای عومەر ﷺ دانیشتبووم، كۆمەڵە سوارییەك لە شامەوە هاتن، عومەر ﷺ هەواڵی حاڵیانی پرسی و گوتی: ئایا خەڵكی شام پەلە دەكەن لە شكاندنی ڕۆژووەكەیان، گوتی: بەڵێ، عومەر ﷺ گوتی: بەردەوام لە خێردان هەتا بەوشێوەیەبن، و چاوەڕوانی دەركەوتنی ئەستێرە نەكەن وەك ئەوەی خەڵكی عێراق چاوەڕوانی دەكەن.

و لە ئەبوجەمرەی زوبەعییەوە: (أَنَّهُ كانَ يُفْطِرُ مَعَ ابْنِ عَبّاسٍ فِي رَمَضانَ فَكانَ إذا أمْسى، بَعَثَ رَبيبًا لَهُ يَصْعَدُ ظَهْرَ الدّارِ، فَلَمّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ أذَّنَ فَيَأْكُلَ، ونَأْكُلَ فَإذا فَرَغَ أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَيَقُومَ يُصَلِّي، ونُصَلِّيَ مَعَهُ)(١).

واتە: لەگەڵ ئیبن عەباسدا ﷺ لە ڕەمەزاندا ڕۆژووی دەشكاند، نزیكی خۆرئاوابوون، كوڕی هاوسەرەكەی (گوردە،ربيب) دەناردە سەربانی خانووەكەی، كاتێك خۆر ئاوادەبوو بانگیدەدا و ڕۆژووەكەی دەشكاند، و ئێمەش لەگەڵیدا نانمان دەخوارد، كە لە خواردنەكەمان دەبووینەوە قامەتدەكرا بۆ نوێژ، و نوێژمان لەگەڵدا دەكرد.

بوخاری لە صەحیحەكەیدا بابەتێكی هێناوە: (بابٌ مَتى يَحِلُّ فِطْرُ

(١). أخرجه ابن أبي شيبة.

الصّائِم؟) و دەڵێت: (وِأفْطَرَ أبو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ حِينَ غابَ قُرْصُ الشَّمْسِ).

واتە: کەی کاتی شکاندنی ڕۆژوو حەڵاڵ دەبێت، و دەڵێت: ئەبوسەعیدی خودری ﵁ کاتێك بازنەی خۆر ئاوابووایە ڕۆژووی دەشکاند.

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەعیدی کوڕی مەنصور و ئەبوبەکری کوڕی ئەبوشەیبە سەنەدی ئەو ئەسەرەیان گەیاندووە لە ڕێگای عبدالواحدی کوڕی ئەیمەن لە باوکییەوە دەڵێت: (دَخَلْنا عَلى أَبِي سَعِيدٍ فَأَفْطَرَ ونَحْنُ نَرى أنَّ الشَّمْسَ لَمْ تَغْرُبْ)، واتە: ڕۆیشتینە ژوورەوە بۆ لای ئەبوسەعید ڕۆژووەکەی شکاند، و ئێمە وامان دەبینی خۆرئاوا نەبووە؛ ئەمە بەڵگەی تێدایە کە ئەبوسەعید ﵁ کاتێك دڵنیابوو خۆر ئاوابووە، زیاتر لەوە چاوەڕوانی نەدەکرد، و لای نەکردەوە بۆ هاوڕابوونی ئەو کەسانەی لەگەڵیدابوون[١].

و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: سوننەتە پەلە بکرێت بۆ ڕۆژووشکاندن کاتێك خۆرئاوا دەبێت، ئیعتبار بە ئاوابوونی خۆرە نەوەك بانگدان،

(١). (فتح الباري)(٤/١٩٦).

بەتايبەت لەم سەردەمە كە خەڵك پشت بە ساڵنامە(تقويم) دەبەستن، پاشان ئەو كاتانە بە سەعاتەكانيان ڕێكدەخەن، لەوانەيە پێش يان پاش بكەوێت، ئەگەر بينيت خۆر ئاوابوو، و خەڵك هێشتا بانگيان نەدابوو، بۆت هەيە ڕۆژووەكەت بشكێنيت، و ئەگەر بانگيشبدەن تۆ ببينيت خۆرئاوا نەبووە بۆت نييە ڕۆژووەكەت بشكێنيت، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: ((إذا أقْبَلَ اللَّيْلُ مِن هاهُنا وأشارَةَ إلى المَشْرِقِ، وأدْبَرَ النَّهارُ مِن هاهُنا وأشارَةَ إلى جِهَةَ المغرب، وغَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَقَدْ أفْطَرَ الصّائِمُ))[١].

واتە: ئەگەر شەو لە ڕۆژهەڵاتەوە داهات، و ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە كۆتايی هات، و خۆرئاوابوو، ڕۆژووەوان ڕۆژووەكەی دەشكێنێت.

و ئەو ڕووناكييە بەهێزەی دەمێنێتەوە زيانی نييە دوای ئاوابوونی خۆر، هەندێك خەڵك دەڵێن: ڕۆژووەكەمان ناشكێنين هەتاكو بازنەی خۆر ئاوادەبێت و كەمێك تاريكی دادێت، ئەوە هيچ ئيعتبارێكی نييە، بەڵكو سەيری بازنەی خۆر بكە هەركاتێك لای سەرەوەی ئاوابوو، سوننەتە ڕۆژووبشكێنيت[٢].

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

(٢). (الشرح الممتع)( ٦/٤٣٤-٤٣٥).

و ئەلبانی لەسەر فەرموودەکەی سەهل ﷺ : ((أمَرَ رَجُلًا فَأوْفى عَلى نَشَزٍ))، دەڵێت: ئەم فەرموودەیە گرنگیدانی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدایە بۆ پەلەکردن بۆ ڕۆژووشکاندن دوای ئەوەی دڵنیابوو کە خۆر ئاوابووە، فەرمانی دەکرد کەسێك سەرکەوێتە سەرشوێنێکی بەرز، بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنێت خۆر ئاوابووە و ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ئەوەش بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرموودەیەتی ﷺ کە دەفەرموێت: ((لا يَزالُ النّاسُ بخَيْرٍ ما عَجَّلُوا الفِطْرَ))، بەڕاستی جێگەی داخە ئەمڕۆ دەبینین خەڵکانێك پێچەوانەی سوننەتیان کردووە، زۆریان بە چاویان ئاوابوونی خۆر دەبینن، کەچی ڕۆژووەکەیان ناشکێنن هەتاکو بانگی شارەکەیان نەبیستن، نازانن، یەکەم: بانگ نادرێت لە کاتی خۆر ئاوابوون، بەڵکو بە تەوقیتی فەلەکی بانگدەدەن، و دووەم: لەوانەیە لە ناوچەیەك خۆر ئاوابوون تێدا جیاوازبێت و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەهۆی شاخ و شیوەکانییەوە، کەسانێکمان بینی دەیانبینی خۆرئاوا دەبێت ڕۆژوویان نەدەشکاند!، و کەسانێکی تر هێشتا خۆر دیاربوو ڕۆژووەکەیان دەشکاند چونکە بیستیان بانگیداوە؟![١].

  

(١). (السلسلة الصحيحة)(١١٨/٥).

## تاوانی ڕۆژووشکاندن پێش خۆر ئاوابوون

پێویستە موسڵمان دڵنیابێت لەوەی خۆر ئاوابووە پاشان ڕۆژووەکەی بشکێنێت، و پەلەکردن لە ڕۆژووشکاندن مانای ئەوە نییە پێش هاتنی کاتی شەرعی کەسێك ڕۆژووەکەی بشکێنێت، هەرکەسێك ڕۆژووەکەی بشکێنێت پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە و ڕۆژووەکەشی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەبوئومامەی باهیلی ﵁ فەرموودەیەکی درێژی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە تێیدا هاتووە: ((بينا أنا نائمٌ إذ أتاني رجلانِ فأخذا بِضَبعيَّ فأتيا بي جبلًا وعرًا فقالا لي: اصعَد، فقلتُ: إنِّي لا أطيقُهُ، فقالا: إنّا سنسهِّلُهُ لكَ فصعِدتُ حتّى إذا كنتُ في سَواءِ الجبلِ إذا أنا بأصواتٍ شديدةٍ، قلتُ: ما هذهِ الأصواتُ: قالوا: هذا عُوِيُّ أهلِ النّارِ ثمَّ انطلقَ بي فإذا أنا بقومٍ معلَّقينَ بعراقيبِهم مشقَّقةٍ أشداقُهم تسيلُ أشداقُهم دمًا، قالَ: قلتُ: منْ هؤلاءِ، قالَ هؤلاءِ الَّذينَ يُفطِرونَ قبلَ تحلَّةِ صومِهم))[١].

واتە: کاتێك خەوتبووم دوو پیاو هاتن بۆ لام هەردوو مەچەکیان

(١) . أخرجه النسائي في (السنن الكبرى)، وابن خزيمة وابن حبان والحاكم واللفظ له وصححه الألباني.

گرتم، و بردمیان بۆ لای شاخێکی سەخت گوتیان: سەرکەوە، گوتم: ناتوانم بەسەر ئەو شاخەدا سەرکەوم، گوتیان: ئێمە سەرکەوتنت بۆ ئاسان دەکەین، سەرکەوتم، هەتا گەیشتمە لوتکەی شاخەکە، دەنگ و هاواری زۆربەرزم بیست، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەوە ناڵە و هاواری دۆزەخییەکانە، پاشان بردمیان بینیم کەسانێك بە پێیاندا سەر بەرەو خوار هەڵواسراون، و دەمیان شەقکراوە و خوێنی لێ دەچۆڕێت، گوتم: ئەمانە: کێن؟، گوتی: ئەمانە ئەو کەسانەن ڕۆژووەکەیان دەشکێنن پێش ئەوەی کاتی ڕۆژووشکاندن هاتبێت.

  

## تێبینییەکی گرنگ

له قسەی ئەو دوو زانا بەڕێزەوە ئەلبانی و ئیبن عوسەیمین بەڕەحمەتبن چەند ڕاستییەکمان بۆ دەسەلمێت کە ئێستا لە واقعدا بەرجەستەیە، زۆربەی خەڵك باوەڕیان وایە دەبێت بانگی مەغریب بدات پاشان ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ئەوەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، بەڵکو دەبێت بانگدەرەکان چاودێری ئاوابوونی خۆر بکەن هەرکات ئاوابوو پێویستە بانگ بدەن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الإمامُ ضامِنٌ والمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ اللَّهُمَّ أرْشِدِ الأئِمَّةَ واغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ))[١].

واتە: ئیمام زامنی کەموکورتی نوێژی ئەو کەسانە دەکات لە دوایەوە نوێژدەکەن، و بانگدەرەکان ئەمیندارن و دەبێت چاودێری کاتەکانی نوێژ بکەن و لە کاتی خۆیدا بانگ بدەن، پەروەردگارا هیدایەتی ئیمامەکان بدە، و لە کەموکورتی بانگدەرەکان خۆشبە.

کەواتە: بانگدان و ڕۆژووشکاندن پەیوەستە بە ئاوابوونی خۆرەوە،

(١). أخرجه أحمد وأبو داود والترمذي وصححه الألباني.

هەرکاتێك خۆر ئاوابوو ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و بانگ دەدرێت بۆ نوێژی مەغریب، بەڵام حاڵەتێك خەریکبوو دەبوو بە دیاردە لە هەندێك لە مزگەوتەکان، هەندێك کەس پێش ئەوەی بانگبدات ڕۆژووەکەیان بە پێش چاوی خەڵکەوە دەشکاند و دەنگە دەنگێکی زۆر دروست دەبوو، بیانووی ئەو کەسانە ئەوەبوو کە خۆرئاوابووە و بانگ نەدراوە بۆیە ڕۆژووەکەیان دەشکێنن، دەبێت ئەو کەسانە بزانن، ئەو کردەوەیان پێچەوانەی ڕێسا شەرعییەکانە، (دَرْءُ المَفاسِدِ أوْلى مِن جَلْبِ المَصالِحِ)، واتە: پاڵنان و لە ناوبردنی مەفسەدەکان لە پێشترە لە هێنانی بەرژەوەندییە شەرعییەکان.

واتە: ئەگەر کەسێك بەو کردەوەیە بیەوێت سوننەتێك زیندوو بکاتەوە بەڵام فیتنە و بشێوییەك بنێتەوە پێویستە بەوشێوەیە ئەو سوننەتە زیندوونەکاتەوە بۆ ئەوەی ڕێگە لە سەرهەڵدانی ئەو فیتنە و بشێوییە بگرێت، بەڵکو دەبێت هەوڵبدرێت لەسەر دوو ئاست ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێت، ئەگەر کاتی بانگدان جیاوازبوو لەگەڵ کاتی ئاوابوونی خۆر، یەکەم: بە هەوڵدان لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان، دووەم: پێویستە هەوڵ بدرێت بۆ موسڵمانان ڕوون بکرێتەوە و بۆیان بسەلمێنن سوننەتە کاتێك خۆر ئاوابوو ڕۆژووەوان ڕۆژوو بشکێنێت، ئەمە لە لایەك.

لە لایەکی ترەوە وەك شێخ ئەلبانی دەڵێت: لەوانەیە لە ناوچەیەکدا

خۆر ئاوابوون جیاوازبێت، ئێستا ئەو تەقویمەی بەرکارە لە ناوچەی سلێمانی کە ناوچەیەکی زۆر فراوانە هەموو پارێزگای سلێمانی و ئیدارەی گەرمیان و ئیدارەی ڕاپەڕین هەمان کاتی بانگدانیان هەیە، بە جۆرێکە لە هەندێك شوێن پێنج بۆ شەش خوولەك دوای ئاوابوونی خۆر بانگ دەدرێت، و لە قەزایەك کەسێك پێی ڕاگەیاندم بانگ دەدات هێشتا خۆرئاوا نەبووە، پێویستە ئەوە ڕێك بخرێتەوە و هەرشارێك کاتی بانگدانی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەگەر وانەبێت ئەو ناکۆکییە هەردەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت.

  

## کەسێك وابزانێت خۆر ئاوابووە و ڕۆژووەکەی بشکێنێت

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنهما دەڵێت: ((أفْطَرْنا عَلى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ))، قِيلَ لِهِشامٍ: فَأُمِرُوا بِالقَضاءِ؟ قالَ: لاَ بُدَّ مِن قَضاءٍ، وقالَ مَعْمَرٌ: سَمِعْتُ هِشامًا لاَ أدْرِي أقَضَوْا أمْ لاَ[١].

واتە: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك هەوربوو ڕۆژوومان شکاند، پاشان خۆر دەرچوو، پرسیارکرا لە هیشام کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە: فەرمانیان پێکرا ئەو ڕۆژە قەزابکەنەوە؟ گوتی: پێویستە قەزای بکەنەوە، و مەعمەر دەڵێت: گوێم لێبوو هیشام دەیگوت: نازانم ئەو ڕۆژەیان قەزاکردەوە یاننا.

و زەیدی کوڕی وەهەب دەڵێت: (أفْطَرَ النّاسُ فِي زَمانِ عُمَرَ قالَ: فَرَأيْتُ عِساسًا أُخْرِجَتْ مِن بَيْتِ حَفْصَةَ، فَشَرِبُوا فِي رَمَضانَ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ مِن سَحابٍ فَكَأنَّ ذَلِكَ شَقَّ عَلى النّاسِ، وقالُوا: نَقْضِي هَذا اليَوْمَ؟ فَقالَ عُمَرُ: ولِمَ؟ فَواللَّهِ ما تَجَنَّفْنا لِإثْمٍ)[٢].

---

(١). أخرجه البخاري.
(٢). أخرجه عبدالرزاق في المصنف.

واتە: لە سەردەمی عومەر رضي الله عنه خەڵك ڕۆژوویان شکاند، قاپێکیان لە ماڵی حەفصەوە رضي الله عنها هێنا، ئاویان خواردەوە لە ڕەمەزاندا، پاشان خۆردەرچوو لە پشتی هەورەوە، خەڵك ناڕەحەتبوون بۆ ئەوە، و گوتیان: ئەم ڕۆژە قەزا دەکەینەوە، عومەر رضي الله عنه گوتی: بۆچی قەزای بکەینەوە؟، سوێند بە خوا مەبەستمان خراپە و تاوان نەبوو.

بەڵام بەیهەقی لە (السنن الكبرى) چەند ڕیوایەتێکی لە پێشەوا عومەرەوە رضي الله عنه هێناوە یەکێك لەوانە: لە بیشری کوڕی قەیسەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: (عن عُمَرَ بنِ الخطابِ رضي الله عنه قال: كُنتُ عِندَه عَشيَّةً في رَمَضانَ وكانَ يَومَ غَيمٍ، فظَنَّ أنّ الشَّمسَ قَد غابَت فشَرِبَ عُمَرُ وسَقانِي، ثُمَّ نَظَروا إلَيها على سَفحِ الجَبَلِ فقالَ عُمَرُ: لا نُبالِي واللَّهِ، نَقضِي يَومًا مَكانَه).

واتە: لای عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه بووم لە ئێوارەیەکی ڕەمەزاندا، ئاسمان هەوربوو، وایزانی برد خۆر ئاوابووە، ئاوی خواردەوە و ئاویشی بە مندا، پاشان لە پەنای شاخێکەوە خۆریان بینی، عومەر رضي الله عنه گوتی: گرنگی پێ نادەین سوێند بە خوا، ڕۆژێك لە بری ئەوە قەزا دەکەینەوە.

دوای ئەوە بەیهەقی دەڵێت: ئەم ڕیوایەتانە لە عومەری کوڕی

خەتابەوە رضي الله عنه لەسەر قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژە، بەڵگەیە لەسەر هەڵەی ئەو ڕیوایەتە لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە لەسەر قەزا نەکردنەوەی[١].

دوای ئەوەی خۆر دەرکەوتەوە بەردەوام دەبێت لەسەر ڕۆژووەکەی و هیچ ناخوات هەتاکو خۆرئاوا دەبێت، بەڵام زانایان ناکۆکن لە قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژە، ئیبن حەجەر دەڵێت: زانایان ناکۆکن لەم پرسە و جمهور بۆچوونیان وایە واجبە ئەو ڕۆژە قەزا بکاتەوە...، و قەزا نەکردنەوە لە موجاهید و حەسەن و ئیسحاقەوە ڕیوایەتکراوە و ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدەوە و هەڵبژاردەی ئیبن خوزەیمەیە[٢].

و قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژە بۆچوونی لیژنەی هەمیشەی فەتوا و ئیبن بازە، و قەزانەکردەوەی بۆچوونی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە و ئیبن عوسەیمینە، و ئیبن تەیمییە لەسەر فەرموودەکەی ئەسمائی کچی ئەبوبەکر رضي الله عنهما دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژە واجب نییە، چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردبان بە قەزاکردنەوە باسەکەی بڵاودەبوویەوە، وەك چۆن باسی

(١). (السنن الكبرى)(٨/٤٦٥).
(٢). (فتح الباري)(٤/٢٠٠).

ڕۆژووشکاندنەکەیان گێڕدراوەتەوە، کاتێك باسی ئەوەیان نەگێڕاوەتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێ نەکردوون، ئەگەر بگوترێت هیشام دەڵێت: فەرمانیان پێکراوە بە قەزاکردنەوەی، وەڵامەکەی ئەوەیە هیشام ئەوەی بە ڕەئی خۆی گوتووە، و ئەوە لە فەرموودەکە نییە، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە زانستی نەبووە لەو بابەتە مەعمەر دەڵێت: گوێم لە هیشام بوو دەیگوت: نازانم ئەو ڕۆژەیان قەزاکردەوە یاننا، بوخاری باسی ئەمەی کردووە...، و هیشام لە عروەی باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: فەرمانیان پێنەکراوە بە قەزاکردنەوە، و عوروە لە هیشامی کوڕی زاناترە، ئەوە بۆچوونی ئیسحاقی کوڕی ڕاهویەیە[١].

  

(١). بڕوانە: (مجموع الفتاوى)(٢٥/٢٣١-٢٣٢).

## بەربانگ جیاوازە لە ژەمی ئێوارە

ئەوەی لە مەفهومی دەقە شەرعییەکانەوە دەرکەوێت بەربانگکردن جیاوازە لە ژەمی ئێوارە، چونکە لە کاتی بەربانگکردندا باسی خواردنی چەند خورمایەك یان چەند قومێك ئاو کراوە، و زانراوە چەند خورمایەك یان چەند قومێك ئاو بریتی نییە لە ژەمی ئێوارە، ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەڵێت: ((كانَ رسولُ الله ﷺ يُفْطِرُ قَبْلَ أنْ يُصَلِّي عَلى رُطَباتٍ، فَإنْ لَمْ تَكُنْ رُطَباتٌ فَتُمَيْراتٌ، فَإنْ لَمْ تَكُنْ تُمَيْراتٌ حَسا حَسَواتٍ مِن ماءٍ))[١].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی دەشکاند پێش ئەوەی نوێژ بکات بە چەند خورمایەکی ڕوتاب، ئەگەر نەبووایە بە خورمای وشك، ئەگەر نەبووایە چەند قومێك ئاوی دەخواردەوە.

ئەوەش مانای ئەوەی تێدایە موسڵمان ڕۆژووەکەی بشکێنێت پاشان فریای نوێژی مەغریب بکەوێت لە مزگەوت بە کۆمەڵ لەگەڵ موسڵماناندا نوێژ بکات و بگەڕێتەوە نانی ئێوارە بخوات.

---

(١). أخرجه أبو داود والترمذي والبيهقي وصححه الألباني.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع رضي الله عنهما دەڵێت: ((كُنَّا نُصَلِّي مع النبيِّ ﷺ المَغْرِبَ إِذَا تَوَارَتْ بالحِجَابِ)).

واتە: ئێمە نوێژی مەغریبمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکرد کاتێك خۆر ئاوادەبوو؛ کەواتە دوای بەربانگکردنەوە و خواردنی شتێکی کەم نوێژی مەغریب بەجێ دەهێنرێت، پاشان هەرکەسێك بیەوێت ژەمی ئێوارە دەخوات.

صالح فەوزان دەڵێت: شتێك هەیە پێویستی ئاگارداری لەسەر بدرێت، هەندێك کەس لەسەر خوانی ئیفتارکردن دادەنیشێت و ژەمی ئێوارەی دەخوات، و نوێژی مەغریب بە کۆمەڵ ناکات لە مزگەوت، بەوەش هەڵەیەکی گەورە دەکات، کە دواکەوتنە لە نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوت، و پاداشتێکی گەورە لە دەستی خۆی دەردەکات، و خۆی ڕووبەڕووی سزای دەکاتەوە، ئەوەی شەرعییە بۆ ڕۆژووەوان یەکەمجار ئیفتار بکات، پاشان بچێت بۆ نوێژ لە مزگەوت، دواى ئەوە نانی ئێوارە بخوات[(١)].

  

(١). (الملخص الفقهي)(٣٨١/١).

## بانگدەر کەی ڕۆژوودەشکێنێت

وەك پێشتر لە قسەی هەردوو زانای ناودار ئەلبانی و ئیبن عوسەیمینەوە باسی ئەوەمان کرد ڕۆژووشکاندن و بەربانگکردنەوە وابەستەی خۆرئاوابوونە، کەواتە بانگدەر کە دڵنیابێت خۆرئاوابووە پێش ئەوەی بانگبدات دەتوانێت ڕۆژووەکەی بشکێنێت، و دەتوانرێت ئەم فەرموودەیە بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوە عبداللەی کوڕی ئەبوئەوفا ﷺ دەڵێت: ((سِرْنا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وهُوَ صائِمٌ، فَلَمّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قالَ: انْزِلْ فاجْدَحْ لَنا...))، فەرمانی بە کەسێك کردووە بەربانگیان بۆ ئامادەبکات کاتێك خۆرئاوابووە، سەرەتا فەرمانی بە بانگدان پێ نەکردووە.

بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا ئەگەر لە مزگەوت بانگیدا دەبێت ڕەچاوی دووخاڵ بکات، یەکەم: نابێت پێش ئەوە بانگبدات بە پێش چاوی خەڵکەوە شت بخوات، چونکە زۆربەی خەڵك واتێگەیشتوون نابێت ڕۆژووەوان پێش بانگدان شت بخوات، وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد و دەبێتە هۆکاری دەنگەدەنگ و فیتنە.

دووەم: نابێت ئەو شت خواردنە ببێتە هۆکاری ئەوەی دوابکەوێت و

درەنگ بانگبدات، و ڕۆژووشکاندنی موسڵمانان دوابخات، بەڵکو بە خورمایەك یان چەند قومێك ئاو بەربانگ بکاتەوە پاشان بانگبدات، و ئەگەر دوای بانگدانیش ڕۆژووەکەی بشکێنێت ئاساییە، چونکە سەرقاڵبووە بە کارێکی شەرعییەوە.

  

## بەچی ڕۆژوو بشکێنین

ئەو فەرموودەیەی ئەنەس ﵁ کە باسکرا، ((كانَ رسولُ الله ﷺ يُفطِرُ قبْلَ أنْ يُصَلِّي عَلى رُطَباتٍ، فَإنْ لَمْ تَكُنْ رُطَباتٌ فَتُمَيْراتٌ، فَإنْ لَمْ تَكُنْ تُمَيْراتٌ حَسا حَسَواتٍ مِن ماءٍ)).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە موسڵمان بە چەند خورمایەکی ڕوتاب (شل) ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ئەگەر نەبوو بە چەند خورمایەکی وشك، ئەگەر ئەوەش بەردەست نەبوو چەند قومێك ئاو بخواتەوە.

ئیبن قەیم دەڵێت: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی بە خورما یان ئاو شکاندووە، حیکمەتێکی زۆر وردی تێدایە، ڕۆژوو گەدە لە خۆراك بەتاڵ دەکاتەوە، و جگەر هیچی تێدا دەستناکەوێت هەڵی بمژێت و بیکاتە توانا و بینێرێت بۆ ئەندامەکانی لەش، و شیرینی خێراترین شتە دەگاتە جگەر، و لە هەموو خۆراکێك پێی خۆشترە، بەتایبەت ئەگەر ئەو شیرینییە ڕوتاب بێت، واتە: شلەمەنی بێت، خێرا وەریدەگرێت، و سودی لێ دەبینێت و هێزی بۆ دەگەڕێتەوە، ئەگەر خورمای ڕوتاب نەبوو، خورما باشترینە لەبەر شیرینی و ئەو بەها خۆراکییەی کە تێیدایە، ئەگەر نەبوو، چەند قومێك ئاو گڕی گەدە و

گەرمی ڕۆژوو دادەمركێنێتەوە، و گەدە هێور دەبێتەوە دوای ئەوە بۆ خواردن ئامادە دەبێت و بە چێژەوە وەری دەگرێت[١].

ئایا ئەگەر خورمای ڕوتاب یان خورمای وشك لەگەڵ ئاو زەمزەم هەبوو، هەرسوننەتە خورما پێش ئاوی زەمزەم بخورێت؟ ئەوەی لە فەرموودەكەدا هاتووە سوننەتە كە پێش خستنی خورمایە بەسەر ئاودا بە ڕەهایی، بەڵام ئەگەر خورما بەردەست نەبوو، و ئاوی ئاسایی و ئاوی زەمزەم بەردەست بوون ئەو كاتە ڕۆژووشكاندن بە ئاوی زەمزەم باشترە چونكە ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُ ماءٍ على وجْهِ الأرْضِ ماءُ زَمْزَمَ فِيهِ طَعامٌ مِنَ الطُّعْمِ وشِفاءٌ مِنَ السَّقْمِ))[٢].

واتە: باشترین ئاو لەسەر ڕووی زەوی ئاوی زەمزەمە، خۆراكە بۆ برسێتی، و چارەیە بۆ نەخۆشی.

مەلا عەلی قاری دەڵێت: قسەی ئەو كەسەی كە دەڵێت: سوننەتە بۆ ئەو كەسەی لە مەككەیە بۆ شكاندنی ڕۆژوو ئاوی زەمزەم پێش بخات

(١).( زاد المعاد في هدي خير العباد )(٢٨٧/٤).
(٢). قال الألباني :إسناده حسن، أخرجه الفاكهي في (أخبار مكة)(١١٠٦)، والطبراني (٩٨/١١) (١١١٦٧)، والضياء في (الأحاديث المختارة)(١٣٧)(السلسلة الصحيحة)برقم (١٠٥٦)(٤٤/٣).

بەسەر خورمادا، ڕەتدەکرێتەوە بەوەی پێچەوانەی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، و بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ساڵەی مەککە فەتحکرا چەند ڕۆژێکی زۆر بە ڕۆژووبوو لە مەککە، لێیەوە ڕیوایەتنەکراوە پێچەوانەی عادەتی خۆی کردبێت، بە خورما ڕۆژووی شکاندووە و بە ئاوی زەمزەم پێش خورما ڕۆژووی نەشکاندووە، ئەگەرنا بۆمان نەقڵ دەکرا[١].

و موحیب تەبەری دەڵێت: هەرکەسێك لە مەککە بێت سوننەتە بە ئاوی زەمزەم ڕۆژووەکەی بشکێنێت، لەبەر بەرەکەتی، و ئەگەر ئاوی زەمزەم لەگەڵ خورما کۆ بکاتەوە باشە، و قەستەلانی دەڵێت: ئەم قسەیە ڕەتکراوەتەوە لەبەر ئەوەی پێچەوانەی فەرموودەکانە، و پێچەوانەی ئەو مانایە کە بە شەرعی دانراوە ڕۆژوو بە خورما بشکێنرێت، کە بریتییە لە پاراستنی چاو یان خورما ئەگەر دابەزییە گەدە بە بەتاڵی بەهای خۆراکی هەیە[٢].



(١). (مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح)(١٣٨٦/٤).
(٢). (إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري)(٣٩٣/٣).

## حوکمی ڕۆژووشکاندن بە خورما یان ئاو

لە بابەتی پێشوو ئەوە لە کرداری پێغەمبەری خواوە ﷺ سەلما کە بە خورمای ڕوتاب ئەگەر بەردەستبووایە ڕۆژووی دەشکاند و بەربانگی دەکردەوە، ئەگەرنا بە خورمای وشك یان بە ئاو، کە بەڵگەی ئەوەی تێدایە سوننەتە بەوشێوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەربانگ بکرێتەوە، بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابەتێکی هێناوە: (بابٌ يُفْطِرُ بِما تَيَسَّرَ مِنَ الماءِ أوْ غَيْرِهِ) پاشان ئەو فەرموودەیەی هێناوە کە عبداللەی کوڕی ئەبوئەوفا رضي الله عنه دەڵێت: ((سِرْنا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وهُوَ صائِمٌ، فَلَمّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قالَ: انْزِلْ فاجْدَحْ لَنا...)).

ئیبن حەجەر دەڵێت: واتە: بەربانگکردنەوەکەی بە ئاو بێت یان شتی تری تێکەڵ بکات، و فەرموودەکەی ئیبن ئەبوئەوفای هێناوە، و بە بابەتەکەی ئاماژەی بۆ کردووە، و لەوانەیە ئاماژە بۆ ئەو فەرمانە بکات کە لەو فەرموودەیەدا هاتووە: ((مَن وجَدَ تَمْرًا فَلْيُفْطِرْ عَلَيْهِ ومَن لا فَلْيُفْطِرْ عَلى الماءِ))[١]، کە بۆ واجبوون نییە، و ئەو فەرموودەیە حاکم

---

(١). ئەو فەرموودەیە: عَنْ سَلْمانَ بْنِ عامِرٍ قالَ: قالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((إذا أفْطَرَ أحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلى تَمْرٍ فَإنَّهُ بَرَكَةٌ، فَإنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلى ماءٍ، فَإنَّهُ طَهُورٌ)) رَواهُ أحْمَدُ والتِّرْمِذِيُّ وأبُو داوُدَ وابْنُ ماجَهْ والدّارِمِيُّ، شێخ ئەلبانی لە (الضعيفة)(٦٣٨٣) بە زەعیفی داناوە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیکردووە بە مەرفوعی و ترمزی و ئیبن حبان بە صەحیحیان داناوە، و ئیبن حەزم بۆچوونێکی شازی هەیە دەڵێت: واجبە ڕۆژوو بە خورما بشکێنرێت، ئەگەر نەبوو بە ئاو[١].

  

(١). بڕوانە: (فتح الباري)(١٩٩/٤).

# شکاندنی ڕۆژوو بە خورمای تاك

هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نەهاتووە باس لە خواردنی خورما بکات بە تاك لە کاتی ڕۆژوو شکاندن، و ئەو فەرموودەیە: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ أَنْ يُفْطِرَ عَلَى ثَلَاثِ تَمَرَاتٍ أَوْ شَيْءٍ لَمْ تُصِبْهُ النَّارُ))(١)، زۆر زەعیفە، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: واجب نییە، بەڵکو سوننەتیش نییە مرۆڤ بە تاك ڕۆژووەکەی بشکێنێت، سێ، پێنج، حەوت، یان نۆ، جگە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان جێگیربووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرنەدەچوو بۆ نوێژی جەژن هەتاکو چەند خورمایەکی بە تاك نەخواردایە، جگە لەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەبەست خورمای بە تاك نەخواردووە(٢).

و سەعدی کوڕی ئەبووەقاص ﵁ دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَنِ اصْطَبَحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتِ عَجْوَةٍ، لَمْ يَضُرَّهُ ذلكَ اليومَ سَمٌّ، ولا سِحْرٌ))(٣).

---

(١). قال الألباني رحمه الله: ضعيف جدا، رواه العقيلي في «الضعفاء» (ص ٢٥١) وأبو يعلى في (مسنده)(١٦٣/ ١) واللفظ له وعنه الضياء في (المختارة)(٤٩ /١) كلاهما عن أبي ثابت عبد الواحد بن ثابت عن أنس مرفوعا. (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)(٤٢٤/٢).

(٢). (فتاوى نور على الدرب)(٢/١١).

(٣). أخرجه البخاري ومسلم.

واتە: هەرکەسێك دەمەوبەیان حەوت خورمای عەجوە بخوات، ئەو ڕۆژە ژەهر و جادوو زیانی پێ ناگەیەنن.

بەڵام هەندێك لە زانایانی سەلەف و خەلەف خواردنی خورما یان خواردنەوەی قومە ئاوەکانیان بە تاك بە سوننەت زانیوە، هەندێکیان ئەو فەرموودەی پێشوویان بە حەسەن داناوە: ((يُحِبُّ أَنْ يُفْطِرَ عَلَى ثَلَاثِ تَمَرَاتٍ))، هەروەها ڕەهایی هەندێك فەرموودەی تریان کردووەتە بەڵگە، ئیبن مەسعود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ فَإذا اسْتَجْمَرْتَ فَأَوْتِرْ))[١].

واتە: بێگومان خودا تاکە و تاکی خۆش دەوێت، ئەگەر کەسێکتان بە بەرد خۆی پاککردەوە بە چەند بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە.

ئەبوهورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ))، قالَ أَيُّوبُ :فَكانَ ابْنُ سِيرِينَ يَسْتَحِبُّ الوِتْرَ مِن كُلِّ شَيْءٍ حَتّى لِيَأْكُلَ وِتْرًا[٢].

واتە: بێگومان خوا تاکە و تاکی خۆشدەوێت؛ ئەیوب دەڵێت: ئیبن

---

(١). أخرجه أبويعلى وصححه الألباني.
(٢). أخرجه عبدالرزاق في المصنف.

سیرین تاکی لە هەموو شتێکدا پێخۆشبوو، هەتاکو خواردنیشی بە تاك دەخوارد.

و پرسیارکراوە لە صالح الفوزان: ئایا تاك لە هەموو شتێکی حەڵاڵدا بەکاردەهێنرێت، وەك خواردنەوەی قاوە و جگە لەوەش، یان تەنها بۆ ئەو شتانەیە کە دەقی لەبارەوە هاتووە؟.

لە وەڵامدا دەڵێت: لە هەموو شتێکدا بەکارهێنانی تاك باشە، بەکارهێنانی بەردی تاك بۆ خۆپاککردنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردی بە تاك بەکاردەهێنا بۆ خۆپاککردنەوە، و خورمای ڕوتابی بە تاك دەخوارد، و هەموو کردار و گوفتارەکان تاك بەکاردەهێنرێت، ئەمە لە سوننەتە، ئەگەر ئاوت خواردەوە سێ جار هەناسە دەدەیت، ئەمە تاکە، دوو جار هەناسە مەدە[1].

  

---

(١). بابەتێکی دەنگی.

## دڵخۆشی ڕۆژووەوان لە کاتی بەربانگکردنەوە

ئەبوهورەیرە ﷻ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: خوا ﷻ دەفەرموێت: ((كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إلاَّ الصِّيامَ، فَإنَّهُ لِي وأنا أجْزِي بِهِ، والصِّيامُ جُنَّةٌ، وإذا كانَ يَوْمُ صَوْمِ أحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ ولاَ يَصْخَبْ، فَإنْ سابَّهُ أحَدٌ أوْ قاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إنِّي امْرُؤٌ صائمٌ، والَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصّائمِ أطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِن رِيحِ المِسْكِ، لِلصّائمِ فَرْحَتانِ يَفْرَحُهُما: إذا أفْطَرَ فَرِحَ، وإذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ))[١].

واتە: هەموو کردەوەی مرۆڤ بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو، کە بۆ منە و من پاداشتی دەدەمەوە لەسەری، و ڕۆژوو قەڵغانە، ئەگەر کەسێکتان بە ڕۆژووبوو قسەی نەشیاو و دەنگەدەنگ و هاوار نەکات، ئەگەر کەسێك جنێوی پێدا و شەڕی لەگەڵدا کرد، بابڵێت: من بە ڕۆژووم، سوێند بەو کەسەی نەفسی محمدی بە دەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا ﷻ لە بۆنی میسك خۆشترە، و ڕووژووەوان دوو جار خۆشحاڵ دەبێت: کاتێك ئێوارە ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و بەربانگ دەکاتەوە، و کاتێك لە قیامەتدا دەگاتە دیداری پەروەردگاری خۆشحاڵ دەبێت بەو پاداشتەی لەسەر ڕۆژووگرتنەکەی دەستی دەکەوێت.



(١). أخرجه البخاري ومسلم.

## زیکری دوای ڕۆژووشکاندن

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ڕۆژووی بشکاندایە و بەربانگی بکردایە دەیفەرموو: ((ذَهَبَ الظَّمَأُ وابْتَلَّتِ العُرُوقُ وثَبَتَ الأجْرُ إنْ شاءَ اللَّه))[١].

واتە: تینوێتی ڕۆیشت، و دەمارەکان پاراوبوونەوە، و پاداشت جێگیربوو بە ویستی خوا.

جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەم زیکرە زەعیفە و کرداری پێ ناکرێت، کە موعازی کوڕی زوهرە دەڵێت: پێم ڕاگەیەنرا: ((أنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ إذا أفْطَرَ قالَ: اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ، وعَلى رِزْقِكَ أفْطَرْتُ))[٢].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ڕۆژووی بشکاندایە دەیفەرموو: خوایە بۆ تۆ ڕۆژوومگرت، و بە ڕۆزی تۆ ڕۆژووەکەم شکاند.



(١). أخرجه أبو داود وحسنه الألباني.
(٢). أخرجه أبو داود و ضعفه الألباني.

## دوعای ڕۆژووەوان

دوعاکردنی ڕۆژووەوان بەشێوەیەکی گشتی بەڵگەی لەسەر هاتووە کە خوا ﷻ وەڵامیدەداتەوە و ڕەتی ناکاتەوە، ((ثَلاَثُ دَعَواتٍ مُسْتَجابات: دَعْوَةُ الصّائِم، ودَعْوَةُ المُسافِر، ودَعْوَةُ المِظْلُوم))[(١)].

واتە: سێ نزا و پاڕانەوە وەڵامدەدرێتەوە: دوعای ڕۆژووەوان، و دوعای کەسێك لە سەفەردابێت، و دوعای ستەملێکراو.

بەڵام ئەو فەرموودانەی باسی وەڵامدانەوەی دوعای ڕۆژووەوان لە کاتی بەربانگکردندا دەکەن زەعیفن، ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثلاثةٌ لا تُرَدُّ دعوتُهم: الصائم حين يُفطِرُ، والإمامُ العادلُ، ودعوةُ المظلومِ، يرفعُها اللهُ فوقَ الغمامِ، وتُفتَحُ لها أبوابُ السماءِ ويقولُ الربُّ: وعزَّتي وجلالي لأنصرنَّكِ ولو بعدَ حينٍ))[(٢)].

و عبداللەی کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((إنَّ للصائمِ عندَ فطرِهِ لدَعْوَةٌ ما تُرَدُّ))، قال ابنُ

(١). أخرجه البيهقي وصححه الألباني.
(٢). أخرجه أحمد والترمذي وابن ماجة وضعفه الألباني.

أبي مُلَيْكَةَ: سمعْتُ عبدَ اللهِ بنَ عمرٍو رضي الله عنهما إذا أفطَرَ يقولُ: (اللهمَّ إنِّي أسألُكَ برحمتِكَ التي وسِعَتْ كُلَّ شيءٍ أنْ تغفرَ لِي).[1]

و ئیبن ئەبوئەوفا رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

((نَوْمُ الصّائِمِ عِبادَةٌ، وسُكُوتُهُ تَسْبِيحٌ، ودُعاؤُهُ مُسْتَجابٌ، وعَمَلُهُ مُتَقَبَّلٌ))[2].

  

(١). أخرجه ابن ماجة وضعفه الألباني.
(٢). قال الألباني: ضعيف، رواه أبو محمد بن صاعد في (مسند ابن أبي أوفى)(١٢٠/ ٢)، والديلمي (٩٣/٤)، والواحدي في (الوسيط)(١/ ٦٥/ ١)(الضعيفة)(١٠/٢٣٠) برقم (٤٦٩٦).

# ئامادەکردنی بەربانگ بۆ ڕۆژووەوان

بە گشتی ناندان بە موسڵمانان کارێکی ویستراو و چاکەیە، عبداللەی کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: ((أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: أيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قالَ: تُطْعِمُ الطَّعامَ، وتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلى مَن عَرَفْتَ ومَن لَمْ تَعْرِفْ))[١].

واتە: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: کام ئیسلامەتییە باشترە، فەرمووی: نان بدەیت بە موسڵمانان، و سەلام بکەیت لەو کەسەی دەیناسیت و لەوەشی کە نایناسیت.

و ناندان بە ڕۆژووەوان پاداشتی تایبەتی هەیە، زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا))[٢].

واتە: ئەوەی بەربانگ بدات بە ڕۆژووەوانێك ڕۆژووەکەی پێ بشکێنێت، پاداشتی وەك ڕۆژووەوانەکە دەستدەکەوێت، و هیچ لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم ناکاتەوە.

  

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.
(٢). أخرجه الترمذي وابن ماجه وابن حبان، وصححه الألباني.

## ئەو پاداشتە بەچی بڕێك خۆراك بە دەست دێت

عن أُمِّ عُمارَةَ الأنصارِيَّةِ رضي الله عنها: ((أنّ النبيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْها، فَقَدَّمَتْ إلَيْهِ طَعامًا، فَقالَ: كُلِي، فَقالَتْ: إنِّي صائِمَةٌ، فَقالَ رسول الله ﷺ: إنّ الصائِمَ تُصَلِّي عَلَيْهِ المَلاَئِكَةُ إذا أُكِلَ عِنْدَهُ حَتّى يَفْرغُوا، ورُبَّما قالَ: حَتّى يَشْبَعُوا)). رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

ئەم فەرموودەیە كە ئیمامی ترمزی ڕیوایەتیكردووە و بە حەسەنی داناوە، ئاماژەی ئەوەی تێدایە ڕۆژووەوان تێر بكرێت فریشتە سەڵەواتی لەسەر دەدەن، بەڵام شێخ ئەلبانی لە چەند شوێنێك لە كتێبەكانی بە زەعیفی داناوە، لەوانە (سنن الترمذي).

وعَنْ سَلْمانَ قالَ: ((خَطَبَنا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِن شَعْبانَ فَقالَ: مَن فَطَّرَ فِيهِ (رمضان) صائِمًا كانَ مَغْفِرَةً لِذُنُوبِهِ وعِتْقَ رَقَبَتِهِ مِنَ النّارِ، وكانَ لَهُ مِثْلُ أجْرِهِ مِن غَيْرِ أنْ يَنْتَقِصَ مِن أجْرِهِ شَيْءٌ، قالُوا: لَيْسَ كُلُّنا نَجِدُ ما يُفَطِّرُ الصّائِمَ، فَقالَ: يُعْطِي اللَّهُ هَذا الثَّوابَ مَن فَطَّرَ صائِمًا عَلى تَمْرَةٍ، أوْ شَرْبَةِ ماءٍ، أوْ مَذْقَةِ لَبَنٍ)). أخرجه ابن خزيمة.

ئەم فەرموودەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە دەنكە خورمایەك یان قومێك

ئاو یان شیر ئەو پاداشتە دەستەبەر دەکات، بەڵام فەرموودەکە ئەلبانی لە شوێنێك بە مونکەر و لە شوێنێك بە زۆر زەعیفی داناوە، بۆیە ناکرێتە بەڵگە.

ئەوەی دەمێنێتەوە ئەو فەرموودەیە کە بە ڕەهای باسی ئامادەکردنی بەربانگی ڕۆژووەوانی کردووە: ((مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا))، بۆیە زانایان ناکۆکن لەوبارەیەوە، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: زانایان ناکۆکن لە لێکدانەوەی مانای: ((مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا)) گوتراوە: مەبەست ئەوەیە بەربانگی بۆ ئامادە بکات ئەگەر کەمترین شتیش بێت کە ڕۆژووەوان ڕۆژووی پێ دەشکێنێت، ئەگەر خورمایەکیش بێت.

و هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: مەبەست لەوە تێرکردنییەتی، چونکە ئەمە ڕۆژووەوان سودی لێ دەبینێت بە درێژایی شەوەکەی، و لەوانەیە پێویستی بە پارشێویش نەبێت، بەڵام ڕواڵەتی فەرموودەکە ئەوەیە ئەگەر کەسێك تەنها خورمایەکیش بدات بە ڕۆژووەوان پاداشتی ڕۆژووەوانەکەی دەستدەکەوێت.

لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤ بە جدی هەوڵبدات بەربانگ بۆ ڕۆژووەوانان

ئامادە بکات بە گوێرەی توانا، بەتایبەت لەگەڵ پێداویستی ڕۆژووەوانان و هەژاری و نەدارییان، لەبەر ئەوەی نەتوانن بەربانگ بۆ خۆیان دابین بکەن[١].

و شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە لەسەر ئەم فەرموودەیە: ((مَن فَطَّرَ صائِمًا))، دەڵێت: مەبەست لە پێدانی بەربانگ تێرکردنییەتی[٢].

  

---

(١). (شرح رياض الصالحين)(٣١٥/٥).
(٢). (الفتاوى الكبرى)(٣٧٧/٥).

## دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی بەربانگ ئامادە دەکات بۆ ڕۆژووەوان

گومانی تێدا نییەناندان چاکەیە، و پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن صَنَعَ إلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكافِئُوهُ، فَإنْ لَمْ تَجِدُوا ما تُكافِئُونَهُ فادْعُوا لَهُ حَتّى تَرَوْا أنَّكُمْ قَدْ كافَأْتُمُوهُ))[١].

واتە: هەرکەسێك چاکەیەکی بۆکردن، پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر هیچتان نەبوو بیکەنە پاداشتی، ئەوەندە دوعای بۆ بکەن هەتاکو وادەبینن پاداشتتان داوەتەوە.

ئەوە بۆ پاداشتی چاکە لەگەڵکردن بەشێوەیەکی گشتی، و چەند فەرموودەیەك هاتووە تایبەتە بەو کەسانەی نان دەدەن، ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە رضي الله عنه، نان و زەیتی هێنا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خوارد، پاشان فەرمووی: ((أفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصّائِمُونَ، وأكَلَ طَعامَكُمُ الأبرارُ، وصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلائِكَةُ))[٢].

---

(١). أخرجه أبو داود وصححه الألباني.
(٢). أخرجه أبوداود وصححه الألباني.

واتە: ڕۆژووەوانان لاتان ڕۆژووبشکێنن، و چاکەکاران نانتان بخۆن، و فریشتە سەڵەواتتان لەسەر بدەن و دوعای خێرتان بۆ بکەن.

ئەلبانی دەڵێت: بزانە ئەم زیکرە تایبەت نییە بە ڕۆژووەوان دوای ڕۆژووشکاندنی، بەڵکو ڕەهایە، و ئەوەی دەفەرموێت: ((أفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصّائِمُونَ)) ئەوە هەواڵدان نییە بەڵکو دوعایە بۆ ئەو کەسەی خواردنەکەی ئامادەکردووە بۆ ئەوەی خوا یارمەتی بدات خۆراك بۆ ڕۆژووەوانان ئامادە بکات، و پاداشتی ڕۆژووەکەی ئەوانی دەست بکەوێت، ئەوە وەك دوو ڕستەکەی ترە: ((وأكَلَ طَعامَكُمُ الأبرارُ، وصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلاَئِكَةُ))، و فەرموودەکە ئەوەی تێدا نییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژوو بووە، بۆیە دروست نییە تایبەت بکرێت بە ڕۆژووەوانەوە[(١)].

و عبداللەی کوڕی بوسر رضي الله عنه دەڵێت: ((نَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى أبِي، قالَ: فَقَرّبْنا إلَيْهِ طَعامًا ووَطْبَةً، فَأكَلَ مِنها، ثُمّ أُتِيَ بِتَمْرٍ فَكانَ يَأْكُلُهُ ويُلْقِي النّوى بَيْنَ إصْبَعَيْهِ ويَجْمَعُ السّبّابَةَ والوُسْطى، ثُمّ أُتِيَ بِشَرابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمّ ناوَلَهُ الّذِي عَنْ يَمِينِهِ، قالَ فَقالَ أبِي،

(١). (آداب الزفاف)(٧١).

وأخَذَ بِلِجامِ دابّتِهِ: ادْعُ الله لَنا، فَقالَ: اللَّهم بارِكْ لَهُمْ فِي ما رَزَقْتَهُمْ، واغْفِرْ لَهُمْ وارْحَمْهُمْ))(١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ میوانی باوكم بوو، خۆراك و خورمای بورنی و كەشك و ڕۆنی تێكەڵكراومان لێ نزیككردەوە، لێی خوارد، پاشان خورمای بۆ هێنرا، لێی دەخوارد و ناوكەكەی دەردەكردە سەر هەردوو پەنجەی شایەتمان و پەنجە ناوەڕاستینەكەی، پاشان خواردنەوەیان بۆ هێنا لێی خواردەوە و پاشان دایە ئەو كەسەی لای ڕاستییەوەیە، باوكم ڕەشمەی سوارییەكەی گرتبوو پێی گوت: دوعامان بۆ بكە، فەرمووی: پەروەردگارا بەرەكەت بخەرە ئەوەی ڕۆزیتداون، و تاوانیان ببۆشە و لێیان خۆشبە و ڕەحمیان پێ بكە.

  

(١). أخرجه مسلم.

## ئازادکردنی بەندەکان لە کاتی بەربانگدا

جابری کوڕی عبدالله ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ لِلَّهِ عِنْدَ كُلِّ فِطْرٍ عُتَقاءَ وذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ))[1].

واتە: بێگومان خوا ﷻ لە کاتی هەموو بەربانگێکدا کەسانێك ئازاد دەکات لە ئاگری دۆزەخ، ئەوەش لە هەموو شەوێکدا.

لە خوا ﷻ دەپاڕێینەوە یەکێکبین لەو موسڵمانانەی کە لە بەربانگێك لە بەربانگەکانی ڕەمەزاندا ئازادمان دەکات و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارمان دەکات.



(١). أخرجه ابن ماجة، وقال الألباني: حسن صحيح.

## سەرچاوەکان

١. (فتح الباري شرح صحيح البخاري)، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي، دار المعرفة - بيروت ١٣٧٩هـ.

٢. (مجموع الفتاوى)، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، الناشر: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية، عام النشر: ١٤١٦هـ-١٩٩٥م.

٣. (مجموع فتاوى ورسائل العثيمين)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين، دار الوطن - دار الثريا، الطبعة: الأخيرة - ١٤١٣هـ.

٤. (مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح)، علي بن سلطان محمد، أبو الحسن نور الدين الملا الهروي القاري، الناشر: دار الفكر، بيروت -لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ - ٢٠٠٢م.

٥. (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)، محمد ناصر الدين الألباني، دار النشر: دار المعارف، الرياض - المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م.

٦. (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)، محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة: الأولى.

٧. (إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل)، محمد ناصر الدين الألباني، الناشر: المكتب الإسلامي – بيروت، الطبعة: الثانية ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م.

٨. (آداب الزفاف في السنة المطهرة)، أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين، بن الحاج نوح بن نجاتي بن آدم، الأشقودري الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)، الناشر: دار السلام، الطبعة: الطبعة الشرعية الوحيدة ١٤٢٣هـ/٢٠٠٢م.

٩. (شرح رياض الصالحين) محمد بن صالح بن محمد العثيمين، الناشر: دار الوطن للنشر، الرياض الطبعة: ١٤٢٦هـ.

١٠. (الكتاب المصنف في الأحاديث والآثار)، أبو بكر بن أبي شيبة، عبد الله بن محمد بن إبراهيم بن عثمان بن خواستي العبسي (المتوفى: ٢٣٥هـ)، الناشر: مكتبة الرشد – الرياض، الطبعة: الأولى، ١٤٠٩هـ.

١١. (المصنف)، أبو بكر عبد الرزاق بن همام بن نافع الحميري اليماني الصنعاني (المتوفى: ٢١١هـ)، الناشر: المجلس العلمي- الهند يطلب من: المكتب الإسلامي – بيروت الطبعة: الثانية، ١٤٠٣هـ.

١٢. (الشرح الممتع على زاد المستقنع)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين (المتوفى: ١٤٢١هـ)، دار النشر: دار ابن الجوزي، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ - ١٤٢٨هـ.

١٣. (مجموع الفتاوى)تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، (المتوفى: ٧٢٨هـ)، الناشر: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية، عام النشر: ١٤١٦هـ-١٩٩٥م.

١٤. (الفتاوى الكبرى)، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (المتوفى: ٧٢٨هـ)، الناشر: دار الكتب العلمية، الطبعة: الأولى، ١٤٠٨هـ - ١٩٨٧م.

١٥. (زاد المعاد في هدي خير العباد)، محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية (المتوفى: ٧٥١هـ)، الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت - مكتبة المنار الإسلامية، الكويت، الطبعة: السابعة والعشرون، ١٤١٥هـ-١٩٩٤م.



١٦. (إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري)، أحمد بن محمد بن أبى بكر بن عبد الملك القسطلاني القتيبي المصري، أبو العباس، شهاب الدين (المتوفى: ٩٢٣هـ)، الناشر: المطبعة الكبرى الأميرية، مصرالطبعة: السابعة، ١٣٢٣هـ.

١٧. (فتاوى نور على الدرب)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين (المتوفى: ١٤٢١هـ).

١٨. (لسان العرب)، محمد بن مكرم بن على، أبو الفضل، جمال الدين ابن منظور الأنصاري الرويفعى الإفريقى (المتوفى: ٧١١هـ)، الناشر: دار صادر – بيروت، الطبعة: الثالثة – ١٤١٤هـ.

١٩. (الملخص الفقهي)، صالح بن فوزان بن عبد الله الفوزان، الناشر: دار العاصمة، الرياض، المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤٢٣هـ



# ناوەڕۆك

